# ٥٠
# پرسیار و وەڵام
## لە بیروباوەڕدا

دانانی

محمدی کوڕی عبدالوهاب

وەرگێڕانی

حەمزە بەرزنجی

# ٥٠ پرسیارو وەڵام

# لە بـــیروبـــاوەڕدا

دانانی: محمدی کوڕی عبدالوهاب

وەرگێڕانی:حەمزە بەرزنجی

# بەڵگەکانی تەوحید

پرسیاری

١ ئەو سێ بنچینەیە کامانەن کە لەسەر هەموو مرۆڤێک پێویستە بیزانێت؟

**وەڵام:** ئەوەیە کە بەندە پەروەردگاری و دینەکەی و محمدی پێغەمبەری بناسێت.

پرسیاری

٢ پەروەردگارت کێیە؟

**وەڵام:** پەروەردگارم الله یە ئەو خوایەی منیش و سەرجەم دروستکراوانی پەروەردە کردووە بە نیعمەتەکانی، وە هەر ئەو پەرستراومەو پەرستراوی ترم نی یە، بەڵگەش ووتەی الله یە کە دەفەرموێت: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾ الفاتحة: ٢

واتە: هەموو حەمد و ستایشێک بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

هەموو شتەکانیش جگە لە الله لە جیهانیانە و منیش یەکێکم لەو جیهانیانە.

پرسیاری

## ٣ مانای (رب) چییە؟

**وەڵام:** واتە خـــاوەن و پەرســـتراو و هەڵســـوڕێنەری کاروبـــار. هەر ئەویـــش شایستەی پەرستش بۆ ئەنجامدانە.

پرسیاری

## ٤ بە چی پەروەردگارت ناسیوە؟

**وەڵام:** بە هۆی نیشانەکانی دەستەڵاتی و دروستکراوەکانییەوە ناسیومە.

لە ئایەتەکانی بریتییە: لە شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگ.

لە دروستکراوەکانیشـــی وەک حەوت ئاسمانەکان و هەمـوو ئەو شتانەی لە ناویانـــدایە و حەوت زەمیـــنەکەو ئەوەی لە ناویـــان و نێوانیانـــدایە، بەڵگەشـــمان ووتەی الله یە کە دەفەرموویـــت: ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيۡلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُۚ لَا تَسۡجُدُواْ لِلشَّمۡسِ وَلَا لِلۡقَمَرِ وَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ٣٧﴾ فصلت: ٣٧

واتە: لە نیشانە و بەڵگەکانی دەسەڵاتی پەروەردگار شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگە، هەرگیز نەکەن سوژدە بۆ خۆر، یان مانگ ببەن، بەڵکو سوژدە تەنها بۆ ئەو خوایە ببەن کـە دروسـتی کـردوون، ئەگـەر ئێـوە خۆتـان بـە بەنـدەی ڕاستەقینەی ئەو دەزانن و هەر ئەو دەپەرستن.

وە دەفەرموویـــت: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ بِأَمۡرِهِۦٓۗ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٥٤ ﴾ الأعراف: ٥٤

واتە: بێگومـان پـەروەردگارتان (الله)یـە کـە دروسـتکاری ئاسـمانەکان و زەویـە لـە مـاوەی شـەش ڕۆژدا، پاشـان لەسـەر عـەرش بەرزو بڵند بـوو ، بەشـەو، ڕۆژ دادەپۆشـێت؛ لەکاتێکـدا بەشـێنەیی عەودالـە بەدوایـدا، خـۆرو مانگ و ئەستێرەکان (هەر هەموویان) بە فـەرمانی خـوا کەوتوونەتـە گـەڕو لـە فـەرمانی دەرنـاچن، ئاگـادار بـن و بـزانن و تێفکـرن کـە: هـەرچی دروسـتکردن و بڕیاردانـە هـەر بـۆ ئـەوە، پیـرۆز و گەورەیـە زاتـی (الله) پەروەردگاری جیهانیان.

پرسیاری

## ٥ دینت چییە؟

**وەڵام:** دینم ئیسلامە، ئیسلامیش بریتییە لە تەسلیم بوون و ملکەچی تەنها بۆ الله. بەڵگەش ووتەی الله یە کە دەفەرموویت: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ ﴾ آل عمران:

واتە: بەڕاستی دین و ئاینی پەسەند لای خوا تەنها ئاینی ئیسلامە.

وە بەڵگەیەکی تریش ووتەی الله یە کە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾ آل عمران: ٨٥

واتە: جا ئەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لەقیامەتیشدا لە خەسارەتمەند و زەرەرمەندانە.

وە بەڵگەیەکی تریش ووتەی الله یە کە دەفەرمووێت: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾ المائدة: ٣

واتە: ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەکەتانم بەکۆتایی گەیاندو نازو نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامەو دین و ئاینتان.

پرسیاری

**٦ ئەم دینە لەسەر چی بینا بووە؟**

**وەڵام:** لەسەر پێنج پایە دامەزراوە، یەکەمیان شایەتی دانە بەوەی هیچ پەرستراوێک نییە بە هەق جگە لە الله وە محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەندە و نێردراوەی الله یە، وە نوێژ بە جوانی ئەنجام بدەیت، وە زەکات بدەیت، وە مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو ببیت، وە حەجی کەعبە بە جێ بهێنیت ئەگەر توانات هەبوو.

پرسیاری

## ٧ باوەڕ چییە؟

**وەڵام:** بریتیە لەوەی باوەڕت هەبێت بە الله و مەلائیکەتەکانی و کتێبەکانی و پەیامبەرانی و ڕۆژی دوایی و باوەڕت بە قەدەر هەبێت چاک و خراپی، بەڵگەش ووتەی الله یە کە دەفەرموێت: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ﴾ البقرة: ٢٨٥

واتە: پێغەمبەر و ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی لە لایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە خوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی ...

پرسیاری

## ٨ ئیحسان چییە؟

**وەڵام:** بریتییە لەوەی الله بپەرستیت وەک ئەوەی کە دەیبینیت، خۆ ئەگەر تۆ نایبینیت بێ گومان ئەو دەتبینێت، بەڵگەش لەسەر ئەمە ووتەی الله یە کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ١٢٨﴾ النحل: ١٢٨

واتە: بێ گومان الله تعالی لەگەڵ ئەو کەسانەدایە کە خۆیان پاراستووە لە گوناهو هەروەها ئەوانەش کە موحسینن (چاکەکارو چاکەخوازن).

پرسیاری

## ٩ پێغەمبەرت کێیە؟

**وەڵام:** پێغەمبەرم محمدی کوڕی عبدالله ی کوڕی عبد المطلبی کوڕی هاشمە، وە هاشم لە هۆزی قورەیشە، وە قورەیش لە کنانەیە، وە کینانە لە عەرەبە، عەرەنیش لە نەوەی إسماعیلی کوڕی ابراهیمە، وەإسماعیلیش من نەوەی إبراهیمە، وإبراهیمیش لە نەوەی نوحە عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ.

پرسیاری

## ١٠ بە چ شتێک بوو بە (نەبی) و بە چ شتێک بوو بە (ڕەسول)؟

**وەڵام:** بە ئایەتی (اقرآ) بوو بە نەبی و بە ئایەتی (المدثر) بوو بە ڕەسول.

پرسیاری

## ١١ موعجیزەکانی چین؟

**وەڵام:** ئەم قورئانەیە کە سەراپای دروستکراوان دەستەوستان بوون سورەتێکی هاووێنەی بهێنن، نەیانتوانی ئەوە بکەن لەگەڵ ئەو زمانپاراوی و زیرەکی و دوژمنایەتییان کە هەیانبوو بۆ پێغەمبەرو شوێنکەوتووانی. بەڵگەش ووتەی الله یە کە دەفەرموویت: ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٢٣﴾

البقرة: ٢٣

واته: جا ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان لەم (قورئانە پیرۆزە) هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محمد صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سوورەتێکی وەك ئەو بهێنن، هاوپەیمان و هاوکارەکانیشتان جگە لە الله (بۆ ئەو مەبەستە) بانگ بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن.

وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویێت: ﴿قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ٨٨﴾ الإسراء: ٨٨

واته: ئەی محمد صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ پێیان بڵێ: سوێند بە الله ئەگەر هەموو ئادەمیزاد و پەریەکان کۆ ببنەوە و (هەوڵی بەردەوام بدەن تا) قورئانێکی وەکو ئەمە دانێن و بیهێننە (مەیدان) ناتوانن کاری وابکەن و ناتوانن لە وێنەی بهێنن، ئەگەر چی هەموو لایەکیان ببنە پشتگیرو یارمەتیدەری یەکتر.

## پرسیاری

## ١٢ بەڵگە چییە لەسەر ئەوەی کە ئەو پێغەمبەری الله یە؟

**وەڵام:** ووتەی الله تعالی یە کە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوۡ قُتِلَ ٱنقَلَبۡتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡۚ وَمَن يَنقَلِبۡ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗاۗ وَسَيَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ١٤٤﴾ آل عمران: ١٤٤

واتە: موحەممەدیش تەنها هەر پێغەمبەرێکە و بەر لەویش گەلێ پەیامبەرانی تر هاتوون ئەگەر ئەو وەفاتیکرد وە یان کوژرا و شەهیدبوو ئێوە پاشگەز دەبنەوە و لەدین وەردەگەڕێن؟ خۆ هەرکەسێکیش پاشگەز بێتەوە و لەدین وەرگەڕێ باچاك بزانێت کە هەرگیز ناتوانێ زیانێ بەخوا بگەیەنێت ، بەڵکو هەر لەخۆی زیان دەدات دڵنیاشبن کەخوا پاداشتی شوکرانە بژێران ئەداتەوەو سەریان دەخات.

وە بەڵگەیەکی تر ووتەی الله تعالی یە کە دەفەرموویێت: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا﴾ الفتح: ٢٩

واتە: محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ ڕەوانەکراوی خوایە، ئەوانەش کە لەخزمەتیدان و شوێنی کەوتوون توند و تیژن بەرامبەر بێ باوەڕان و بەبەزەیی و میهرەبانن لە نێوان خۆیاندا، دەیانبینیت سەرگەرمی نوێژ و خواپەرستین، کڕنۆش و سوژدەدەبەن..

پرسیاری

**١٣ بەڵگە چییە لەسەر پێغەمبەرایەتی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ؟**

**وەڵام:** بەڵگەی پێغەمبەرایەتی ووتەی الله تعالی یە کە دەفەرموویێت: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٖ مِّن رِّجَالِكُمۡ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ٤٠﴾ الأحزاب: ٤٠

واتە: محمد وە نەبێ باوکی هیچ کەس لە پیاوانتان بێت بەڵکو پێغەمبەری خوایەو دواهەمینی پێغەمبەرانە..

وە ئەم ئایەتانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەرە و کۆتای پێغەمبەرانە.

پرسیاری

## ١٤ الله تعالی پێغەمبەری بە چ شتێک ڕەوانە کردووە؟

**وەڵام:** بۆ پەرستنی الله بە تەنها و بە بێ هاوبەش دانان بۆی، وە بەوەی خەڵکی لەگەڵ الله هیچ پەرستراوێکی تر بڕیار نەدەن، وە ڕێگری لێ کردوون دروستکراوان بپەرستن لە مەلائیکەت و پێغەمبەران و پیاوچاکان و بەرد و درەخت، هەروەک الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ٢٥﴾ الأنبياء: ٢٥

واتە: ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە، کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە: بێگومان هیچ پەرستراوێک نیە جگە لە من و دەبێت هەر من بپەرستن.

وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ﴾ النحل: ٣٦

واتە:سوێند بە الله بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا

پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها الله بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو تاغوت و پەرستراوێکی تر..

وە دەفەرموویێت: ﴿ وَسۡـَٔلۡ مَنۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلۡنَا مِن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ءَالِهَةٗ يُعۡبَدُونَ ٤٥ ﴾ الزخرف: ٤٥

واتە: تۆ لەو پێغەمبەرانەی کە ناردوومانە پێش تۆ بپرسە، ئایا جگە لە الله ی بەبەزەیی خوای ترمان دیاری کردووە کە بەندایەتی بۆ بکرێت.

وە دەفەرموویێت: ﴿ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ٥٦ ﴾ الذاريات: ٥٦

واتە: بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوەنەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.

بەمەش دەزانرێت کە بە دڵنیاییەوە الله تعالی دروستکاوانی تەنها بۆ ئەوە بەدیهێناوە تا بیپەرستن و بە تەنها عیبادەتی بکەن هەر بۆیە پێغەمبەرانی ناردووە بۆ لای بەندەکانی تا فەرمانیان پێ بکەن بە ئەنجامدانی ئەمە.

پرسیاری

١٥ جیاوازی چییە لە نێوان تەوحیدی پەروەردگارێتی(الربوبية) و تەوحیدی پەرستراوێتی(الألوهية)؟

وەڵام: تەوحیدی پەروەردگارێتی(الربوبية): بریتییە لە کرداری پەروەردگار، وەک بەدیهێنان و ڕۆزی دان و زیندوو کردنەوە و مراندن و

باراندنی باران و سەوز کردنی ڕووەکەکان و بەڕێوەبردنی کاروباری بوونەوەر.

وە تەوحیدی پەرستراوێتی(الألوهية): بریتییە لە کردەوەی بەندە، وەک پاڕانەوەو ترس و هیوا و پشتبەستن و گەڕانەوەو ئومێد و ترس و نەزر و هاناو هاوار و غەیری ئەمانە لە جۆرەکانی عیبادەتەکان.

پرسیاری

١٦ جۆرەکانی عیبادەت چییە کە دروست نییە بۆ غەیری الله ئەنجام بدرێت؟

وەڵام: لە جۆرەکانی وەک: پاڕانەوە، هاوار کردن، پشتبەستن، وە سەربڕینی خۆنزیک خستنەوەو قوربانی، وە نەزر، وە ترسان، وهیوا، و پشتبەستن، و گەڕانەوە، و خۆشویستن، وترس، و ئومێد، و ترس، و پەرستن، و چەمینەوە، و کڕنوش، و ترس، و زەلیلی، و بە گەورە زانین کە لە تایبەتمەندییەکانی پەرستنە.

پرسیاری

١٧ گەورەترین فەرمان چییە کە الله فەرمانی پێ کردووە؟ وە گەورەترین نەهی چییە کە الله نەهی لێ کردووە؟

وەڵام: گەورەترین فەرمانێک کە الله فەرمانی پێ کردبێت بە ئەنجامدانی بریتییە لەوەی بە تەنها بپەرسترێت، وە گەورەترین نەهی یەک کە الله

نەهی لێ کردووە بریتییە لە هاوبەش دانان بۆی، ئەویش بریتییە لەوەی لەگەڵ الله دا لە کەسێکی تر بپاڕێیتەوە یان جۆرێک لە جۆرەکانی تری عیبادەتی بۆ ئەنجام بدرێت، جا هەرکەسێک جۆرێک لە جۆرەکانی عیبادەت بۆ غەیری الله ئەنجام بدات ئەوە ئەو کەسەی کردۆتە پەروەردگارو پەرستراوی و کەسێکی تری کردۆتە هاوبەش لەگەڵ الله دا یان هەر جۆرێک لە جۆرەکانی تری عیبادەت بۆ غەیری الله ئەنجام بدات.

پرسیاری

١٨ ئەو سێ بابەتە چییە کە پێویستە فێری ببین و کاری پێ بکەین؟

وەڵام: یەکەم: بە دڵنیاییەوە الله بەدیهێناوین و ڕۆزی داوین و هەرگیز بە هەڕەمەک و بێ حیکمەت وەلای نەناوین بەڵکو پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردوین جا هەرکەسێک گوێڕایەڵی بکات دەچێتە بەهەشتەوە و هەرکەسێکیش سەرپێچی بکات دەچێتە دۆزەخەوە.

دووەم: بە دڵنیاییەوە ڕازی نابێت بەوەی هیچ کەسێک بکرێتە هاوبەشی لە پەرستنیدا نە مەلائیکەتێکی نزیک لە خۆی و نە پێغەمبەرێکی ڕەوانە کراو.

سێیەم: بێ گومان هەرکەسێک گوێڕایەڵی پێغەمبەر بێت و بە تەنها الله بپەرستێت دروست نییە بۆی کە دۆستایەتی کەسانێک بکات کە دوژمنی الله و پێغەمبەرەکەین ئەگەر چی ئەو کەسە لە نزیکترین کەسە نزیکەکانی بن.

پرسیاری

١٩ مانای ووشەی الله چییە؟

وەڵام: بە واتــای خــاوەنی خــوایەتی و پەرســتراوێتی و بەســەر هەمــوو دروستکراوەکانییەوە.

پرسیاری

٢٠ الله بۆ چ مەبەستێک بەدیهێناوین؟

وەڵام: بۆ پەرستنی.

پرسیاری

٢٢ پەرستنی چییە؟

وەڵام: بە تەنها پەرستن و گوێڕایەڵی کردنی.

پرسیاری

٢١ بەڵگە چییە لەسەر ئەمە؟

وەڵام: ووتەی الله تعالی کە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ٥٦﴾ الذاريات: ٥٦

واتە: بێگومـان مـن پـەری و ئـادەمیزاد م دروسـت نەکردووەتـەنها بـۆ ئـەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.

پرسیاری

## ٢٣ یەکەم شتێک چییە کە الله تعالی لەسەری فەرز کردووین؟

**وەڵام:** بێ باوەڕ بوون بە تاغوت و باوەڕ هێنان بە الله، وە بەڵگەش ووتەی الله تعالی یە کە دەفەرموویێت: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٢٥٦﴾ البقرة: ٢٥٦

واتە: بەهیچ جۆرێک زۆر کردن نیە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا، چونکە بەڕاستی ڕێبازی چاک و دروست؛ ڕوون و ئاشکرا بووە و جیابۆتەوە لە گومڕایی و سەرکەشی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە تاغوت و باوەڕ دامەزراو بهێنێت بەخوا، بێگومان ئەو کەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە، کە هیچ پسان و هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نی یە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە، خوای گەورەش بیسەرو زانایە.

پرسیاری

## ٢٤ العروة الوثقي چییە؟

**وەڵام:** بریتییە لە لا الە الا الله، وە مانای لا الە: نەفی کردنە، وە الا الله: چەسپاندنە.

پرسیاری

### ٢٥ نەفی کردن و چەسپاندن چییە لێرەدا؟

وەڵام: نەفــی کــردنی هەمــوو ئەوانەیە کە جــگە لە الله دەپەرســترێن، وە چەسپاندنی ئەنجامدانی پەرستشە تەنها بۆ الله بە بێ هیچ هاوبەشێک.

❁❁❁

پرسیاری

### ٢٦ بەڵگە چییە لەسەر ئەمە؟

وەڵام: ووتەی الله تعالی کە دەفەرموویێـت: ﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦٓ إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ ٢٦﴾ الزخرف: ٢٦

واتە: ئەو کاتـە وە بیـر بێنـە ئـەی موحەممـەد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ کـە ئیبـراهیم عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ بـــە بـاوك و گەلەکـــەی خـۆی وت: بێگومـان مـن لـەو خوایانەی کە ئێوە ئەیانپەرستن، بێزارو بەریم.

ئەمە بەڵگەی نەفی کردنە، وە بەڵگەی چەسپاندنیش: ﴿إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي ...﴾ الزخرف: ٢٧

واتە: جگە لەو خوایەی کە دروستیکردووم..

❁❁❁

پرسیاری

### ٢٧ تاغوتەکان چەندن؟

وەڵام: زۆرن، وە سەرەکانیان پێنج دانەیە: ئیبلیس نەفرەتی الله ی لێ بێت،

وە هەر کەسێک بپەرسترێت و پێی ڕازی بێت، وە هەر کەسێک خەڵکی بانگ بکات بۆ پەرستنی خۆی، وە هەر کەسێک بەنگەشەی زانینی شتێک لە زانستی غەیب و نادیار بکات، وە هەر کەسێک حوکمی خەڵک بکات بە شتێکی تری جگە لەو قورئانەی الله دایبەزاندووە.

پرسیاری

٢٨ چ کردەوەیەک باشترینی کردەوەکانە دوای دوو شایەتمانەکە؟

وەڵام: باشترینیان پێنج نوێژە فەرەکەیە، ئەویش چەندان مەرج و ڕوکن و واجباتی هەیە، گەورەترین مەرجەکانی نوێژ بریتییە لە: موسڵمانێتی و ژیری و جیاکردنەوەی چاک و خراپ و لەسەرخۆ لابردنی بێ نوێژی و پاککردنەوەی پیسییەکان و داپۆشینی عەورەت و ڕوو کردنە قیبلە و چوونە ناو کاتەکەی و نییەت هێنان.

وە رووکنەکانیشی چواردە دانەیە: بە پێوە وەستان ئەگەر توانای هەبوو، وە تەکبیری یەکەمی نوێژ دابەستن، و خوێندنی سورەتی الفاتحە و، چەمینەوەو، بەرز بوونەوە لە چەمینەوەو، کڕنوش بردن لەسەر حەوت ئەندامەکەو، سەر بەرز کردنەوەو، دانیشتنی نێوان دوو کوڕنووشەکەو، ئارامی بوون و لاشە لە جوڵە کەوتن لەم ڕوکنانەداو، ڕیزبەندی و، تەحیاتی کۆتایی و، دانیشتن بۆی و، صەلاوات دان لەسەر پێغەمبەر و، سەلام دانەوە.

واجباتەکانیشی هەشتن: هەموو تەکبیر کردنەکان جگە لە تەکبیری نوێژ دابەستن و، وتنی: (سبحان ربي العظيم) لە چەمینەوەداو، وتنی (سمع الله لمن حمده) بۆ پێشنوێژ و ئەوانەشی بە تەنها نوێژ دەکەن و، وتنی: (ربنا ولك الحمد) بۆ ئیمام و نوێژخوێنان و ئەوانەشی بە تەنها نوێژ دەکەن و، وتنی: (سبحان ربي الأعلى) لە کوڕنوشدا و، وتنی: (رب اغفر لی) لە نێوان دوو کوڕنووشەکانداو، تەحییاتی یەکەم و، دانیشتن بۆی، ئیتر جگە لەمانە لە ووتەو کردارەکان سوننەتن.

پرسیاری

٢٩ ئایا الله تعالی دروستکراوان زیندوو دەکاتەوە دوای مردن؟ وە ئایا لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکات لەسەر چاکو خراپی کردەوەکانیان؟ وە هەرکەسێکیان گوێڕایەڵییان کردبێت دەیخاتە بەهەشتەوەو؟ ئەوەشیان بێ باوەڕ بوو بێت و هاوبەشی تری بۆ بڕیار دابێت دەیخاتە نا ئاگری دۆزەخ؟

وەڵام: بەڵێ، بەڵگەش ووتەی الله تعالی یە کە دەفەرموێت:﴿زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٧﴾ التغابن: ٧

واتە: ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بە بۆچوونی خۆیان وتیان: هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە، پێیان بڵێ: وا نیە، سوێند بە پەروەردگارم، بەڕاستی هەر زیندوو

دەكرێنەوە، پاشان ئاگادار دەكرێن لە هەموو ئەو كارو كردەوانەی كە ئەنجامتان دەدا، ئەوەش بۆ الله زۆر ئاسان و سادەیە.

وە دەفەرمووێت: ﴿ مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ ﴾ طه: ٥٥

واتە: ئێمە ئێوەمان هەر لەم زەویە دروست كردووە، (دوای ماوەیەك) دەتانخەینەوە ناوی، پاشان جارێكی تر دووبارە لەو زەویە دەرتان دەهێنینەوە (بۆ لێپرسینەوە و وەرگرتنی ئەو پاداشتەی كە شایستەن).

وە لە قورئاندا ئەوەندە بەڵگە هەیە لەسەر ئەمە كە لە ئەژمار نایەت.

پرسیاری

### ٣٠ حوكمی سەربڕین بۆ غەیری الله چییە لەم ئایەتەدا؟

**وەڵام:** حوكمی ئەو كەسە كافرە و هەڵگەڕاوەیە لە دین، وە سەربڕاوی دەستی ناخورێت چونكە دوو ڕێگری تێدا كۆبووەتەوە:

**یەكەم:** چونكە سەربڕاوی دەستی هەڵگەڕاوە لە دینە، سەربڕاوی دەستی مورتەدیش بەكۆدەنگی زانایان دروست نییە بخورێت.

**دووەم:** ئەوە لەو سەربڕاوانەیە كە ناوی غەیری الله ی لەسەر براوە، الله تعالیش ئەمەی حەرام كردووە، وەك دەفەرمووێت: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦۚ ﴾ الأنعام: ١٤٥

واتە: ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ پییان بڵێ: من نابینم و دەستم ناکەوێت لەوەی کە وەحی و نیگام بۆ کراوە هیچ خواردنێکی حەرامکراو لەسەر ئەو کەسەی کە بیخوات، مەگەر خواردنی مردارەوە بوو، یان خوێنێکی ڕژێنراو، یان گۆشتی بەراز، بەڕاستی ئەو قەدەغە کراوە هەر پیسە، یاخود (مالآتێک) کەلە سنووری شەرع دەرچووبێت لە سەر بڕینەکەیدا بەوەی کە ناوی غەیری الله ی لەسەر برابێت..

پرسیاری

## ٣١ جۆرەکانی شیرک و هاوبەش بڕیاردان بۆ الله کامانەن؟

**وەڵام:** جۆرەکانی ئەمانەن: داواکردنی پێویستیەکان لە مردووەکان، وە هاناو هاوار بردن و ڕوو تێ کردنیان لە کاتی ناڕەحەتی، کە ئەمە بنچینەی هاوبەش دانانی جیهانە، چونکە مردوو کردەوەکانی پچڕاوەو هیچی بۆ خۆشی بەدەست نییە نە سوود و نە زیان، چ جای بۆ کەسێک کە هاواری لێ دەکات و داوای شەفاعەتی لێ دەکات تا لای الله بۆی بکات، ئەمەش هۆکارەکەی ئەوەیە ئەو کەسە بێ ئاگایە لە حاڵی شەفاعەتکارو شەفاعەت بۆ لای براو، چونکە الله تعالی هیچ کەسێک بۆی نییە شەفاعەتی لە لا بکات مەگەر بە ئیزنی الله، الله ش داواکردن لە غەیری خۆی نەکردۆتە هۆکاری ئیزن و ڕێپێدانی، بەڵکو هۆکاری ئیزن و ڕێپێدانی کەسێک بۆ لای بریتییە لە تەواوی تەوحید، هەر بۆیە ئەو کەسە

هاوبەشدانەرە هۆکارێکی بەکارهێناوە کە ڕێگرە لە ڕێپێدان و ئیزندانی الله بۆی.

هاوبەشدانانیش دوو جۆرە: هاوبەشدانانێک کەسەکە لە میللەتی ئیسلام دەباتە دەرەوەو ئەویش بریتییە لە شیرکی گەورە، وە هاوباش بڕیاردانێک لە میللەتی ئیسلام کەسەکە ناباتە دەرەوە ئەویش شیرکی بچووکە لە نمونەی شیرکی ڕووپامایی و ڕییاء.

پرسیاری

٣٢ جۆرەکانی نیفاق و دوو ڕوویی چییەو مانای چییە؟

وەڵام: دوو جۆر نیفاق و دوو ڕوویی هەیە: دوو ڕوویی بیروباوەڕ و دوو ڕوویی کرداری.

دوو ڕوویی بیروباوەڕی: لە قورئاندا لە زیاد لە جێگایەکدا باسکردوە، الله تعالى بنجی دۆزەخی بۆ واجب کردوون.

دوو ڕوویی کرداری: لەو فەرمودەیەدایە کە دەفەرموێت: (أربع من كن فيه كان منافقا خالصا، ومن كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق، حتى يدعها: إذا حدث كذب، وإذا عاهد غدر، وإذا خاصم فجر، وإذا اؤتمن خان)

واتە: چوار سیفەت هەیە هەر کەسێک ئەو سیفاتەنەی تێدا بێت مونافیقی تەواوە، هەرکەسێکیش یەکێک لەو سیفاتانەی تێدا بێت ئەوە

سیفەتێکی مونافیقی تێدایە هەتا وازی لێ دەهێنێت: ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات، وە ئەگەر پەیمانی دا ناپاکی لێ دەکات، وە ئەگەر کێشەو دەمەقاڵەی کرد سنوور دەبەزێنێت، وە ئەگەر سپاردەی لەلا دانرا خیانەتی لێ دەکات.

یان وەک دەفەرموویت: (آیة المنافق ثلاث: إذا حدث كذب، وإذا وعد اخلف، وإذا أؤتمن خان).

واتە: نیشانەی مونافیق سێ دانەیە: ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات، وە ئەگەر بەڵێنی دا دەیشکێنێت، وە ئەگەر سپاردەی لە لا دانرا ناپاکی لێ دەکات.

هەندێک زانا دەفەرموون: ئەم جۆرە دوو ڕوویيەی دووەمیان ئەگونجێت لەگەڵ بنچینەی باوەڕدا کۆببێتەوە بەڵام ئەگەر دەستەڵاتی زاڵ بوو بە سەریداو هەموو ئەم سیفاتانەی تێدا کۆبویەوە ئەوکات خاوەنەکەی بە تەواوی لە ئیسلام دەردەکات ئەگەرچی نوێژیش بکات و ڕۆژووش بگرێت و بەنگەشەی ئەوە بکات گوایە موسڵمانە، چونکە ئیمان نەهی دەکات لەم سیفاتانە، خۆ ئەگەر هەمووی لە کەسێکدا کۆبویەوە و ئەوەندەی ئیمان پێ نەبوو ڕێگری بکات لێی، ئەوا ئەو حاڵە تەنها لە مونافیقێکی تەواو دەوەشێتەوە.

پرسیاری

٣٣ پلەی دووەم لە پلەکانی دینی ئیسلام چییە؟

وەڵام: بریتییە لە باوەڕ(ئیمان).

پرسیاری

٣٤ ئیمان چەند بەشە؟

وەڵام: حەفتاو چەند بەشێکە، بەرزترینیان وتنی (لا إله إلا الله) یەو نزمترینیان لابردنی ئازارە لە ڕێگادا، وە شەرمیش بەشێکە لە ئیمان.

پرسیاری

٣٥ پایەکانی باوەڕ چەندن؟

وەڵام: شەشە: بریتییە لەوەی باوەڕ بهێنیت بە الله، وە مەلائیکەتەکانی، و کتێبەکانی، و پێغەمبەرانی، و ڕۆژی دوایی و ، ئیمان بهێنیت بە قەدەر چاک و خراپی.

پرسیاری

٣٦ سێیەم پلە لە پلەکانی دینی ئیسلام چییە؟

وەڵام: بریتییە لە ئیحسان، یەک پایەی هەیە ئەویش بیتییە لەوەی بەو شێوەیە الله بپەرستیت وەک ئەوەی بیبینیت، خۆ ئەگەر تۆ ئەو نابینیت الله دەتبینێت.

پرسیاری

٣٧ ئایا خەڵکی دوای زیندوو بوو کردنەوەیان لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت و پاداشت دەدرێنەوە لەسەر کردەوەکانیان یان نا؟

وەڵام: بەڵێ لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت و پاداشت دەدرێنەوە لەسەر کردەوەکانیان بە بەڵگەی ووتەی الله تعالى کە دەفەرموویت: ﴿لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ بِٱلۡحُسۡنَى ٣١﴾ النجم: ٣١

واتە: (تاقیتان دەکاتەوە) بۆ ئەوەی تۆڵەبسێنێت لەوانەی کە خراپەیان کردووە بە گوێرەی کردەوەکانیان، پاداشتی ئەوانەش کە چاکەیان کردووە بە چاکترین شێوە بداتەوە.

پرسیاری

٣٨ حوکمی ئەو کەسە چییە کە ڕۆژی دوایی بە درۆ دەخاتەوە؟

وەڵام: حوکمی ئەو کەسە ئەوەیە کە بێ باوەڕو کافرە بە بەڵگەی ووتەی الله تعالى کە دەفەرموویت: ﴿زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٧﴾ التغابن: ٧

واتە: ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بە بۆچوونی خۆیان وتیان: هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە، پێیان بڵێ: وا نیە، سوێند بە پەروەردگارم، بەڕاستی هەر زیندوو

دەکرێنەوە، پاشان ئاگادار دەکرێن لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا، ئەوەش بۆ الله زۆر ئاسان و سادەیە.

پرسیاری

٣٩ ئایا هیچ گەلێک هەیە کە الله پێغەمبەری بۆ نە ناردبێت تا فەرمانی پێ بکات بەتەنها الله بپەرستێت و لە طاغوت دوور بکەوێتەوە؟

وەڵام: هیچ گەلێک نەماوە ئیلا الله پێغەمبەری بۆ ڕەوانە کردووە بە بەڵگەی ووتەی الله کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ﴾ النحل: ٣٦

واتە: سوێند بە الله بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها الله بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر..

پرسیاری

٤٠ جۆرەکانی تەوحید چییە؟

وەڵام: ١-تەوحیدی پەروەردگارێتی (توحيد الربوبية): ئەو تەوحیدەیە کە کافران دەریان بڕیوەو دانیان پیایدا ناوە هەر وەک الله دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ

﴿مَن يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أَمَّن يَمۡلِكُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَمَن يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُۚ فَقُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ ٣١﴾ يونس: ٣١

واته: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: کێ هەیە لە ئاسمانەوە (بەهۆی تیشکی خۆرو بارانەوە) و لە زەویەوە (بەهۆی خاک و ئاوو هەواوە) ڕزق و ڕۆزیتان بۆ فەراهەم بهێنێت و پێتان ببەخشێت، ئەی کێ هەیە خاوەنی دەزگاکانی بیستن و بینین بێت (توانای بیستن و بینینیان پێ ببەخشێت) ئەی کێ زیندوو لە مردوو دەردەهێنێت و مردوو لە زیندوو دەردەهێنێت، هەروەها کێیە کە هەموو کارو فرمانەکان جێبەجێ دەکات و گۆڕانکاریان بەسەردا دەهێنێت (لە بەرامبەر هەموو ئەو پرسیارانەوە) خەڵکی دەڵێن: الله، کەواتە پێیان بڵێ: ئایا ناترسن لە سەرەنجامی یاخی بوونتان، ئایا ناترسن لەخەشم و قینی الله؟!

٢-تەوحیدی پەرستراوێتی (توحيد الألوهية): بریتییە لە بە تەنها الله پەرستی لە لایەن هەموو دروستکراوان، چونکە خودا (الإله) لە زمانی عەرەبدا بریتییە لەوەی ڕووی تێ دەکرێت بۆ پەرستن، وە ئەوان دەیانوت الله خوای هەموو خواکانی ترە، بەڵام پەرستراوێکی تریان بۆ بڕیار دەدا وەک پیاوچاکان یان مەلائیکە، وە غەیری ئەوان دەڵێن الله بەمە ڕازییەو ئەمانە دەبنە تکاکارمان لە لای.

٣-تەوحیدی سیفاتەکان (توحيد الصفات): هیچ کات تەوحیدی پەروەردگارێتی و پەرستراوێتی ڕێک نابێت ئیلا بە دانانان نەبێت بە

سیفاتەکان، بەڵام کافرەکان ژێرتر بوون لەوانەی ئینکاری سیفاتەکانی الله دەکەن.

پرسیاری

٤١ چیم لەسەرە لە کاتێکدا الله فەرمانم پێ دەکات بە کارێک؟

وەڵام: حەوت پلەت لەسەر واجبە:

یەکەم:زانست بوون پێی، دووەم: خۆشویستنی، سێیەم: دڵ چەسپان لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارە، چوارەم: کردەوە پێ کردن و ئەنجامدانی، پێنجەم: ئەبێت تەنها مەبەستت ڕەزامەندی الله بێت و بە پێی شەرع ئەنجامی بدەیت، شەشەم: ترسان لە ئەنجامدانی کردەوەیەک بەتاڵی بکاتەوە، حەوتەم: دامەزراوی لەسەری.

پرسیاری

٤٢ ئەگەر مرۆڤ زانی کە الله فەرمانی پێ کردووە بە تەوحید و نەهی لێ کردووە لە ئەنجامدانی شیرک ئایا ئەنجامدانی ئەم پلانەی لەسەر واجب دەبێت؟

وەڵام: پلەی یەکەم: زۆربەی خەڵکی زانیویەتی کە تەوحید حەقە و شیرکیش بەتاڵە، بەڵام پشتی تێ کردووەو پرسیار ناکات! زانیویەتی الله ڕیبای حەرام کردووە کەچی کڕین و فرۆشتن دەکات و پرسیار ناکات! وە

دەزانێت خواردنی ماڵی هەتیو حەرامە و دروستە بە جوانی لێی بخورێت، کەچی سەرپەرشتی ماڵی هەتیو دەکات و پرسیار ناکات!

پلەی دووەم: خۆشویستنی ئەوەی الله دایبەزاندووە و کافر بوونی ئەو کەسەی ڕقی لێی دەبێتەوە، زۆربەی خەڵکی پێغەمبەری الله ی خۆشناوێت، بگرە ڕقی لە خودی پێغەمبەر و ئەو سوننەتەشە کە هێناویەتی، ئەگەر چی ئەشزانێت کە الله دایبەزاندووە.

پلەی سێیەم: دڵچەسپان لەسەر کردەوە کردن و ئەنجامدان، وە زۆرێک لە خەڵکی ئەزانێت و حەقەکەشی خۆشدەوێت، بەڵام دڵی یەکلا نەبۆتەوە لەسەر ئەنجامدانی لە ترسی گۆڕانی ژیانی دونیای.

پلەی چوارەم: ئەنجام دان و کار پێ کردن، زۆرێک لە خەڵکی ئەگەر دڵی چەسپا یان کاری پێ کرد و دوایی بۆی دەرکەوت چەند کەسێک لە نمونەی مامۆستایانێک یان غەیری ئەوان ئەو حەقە بەلایانەوە قورسەو پێی نارەحەتن وازی لێ دێنێت.

پلەی پێنجەم: زۆرێک لەو کەسانەی کاری پێ دەکەن مەبەستیان تەنها ڕەزامەندی الله نییە، خۆ ئەگەر مەبەستیشیان پاک بێت ئەوا لەسەر سوونەت و بە پێی شەرع ئەنجامی نادەن.

پلەی شەشەم: پیاوچاکان لە هەڵوەشاندنەوەی کردەوەکانیان ئەترسان وەک الله تعالی دەفەرموویت: ﴿أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ﴾ الحجرات: ٢

واتە: ...نەوەکو کردەوەکانتان پووچ بێتەوە و هەستیشی پێ نەکەن.

کە ئەمە لە زەمانی ئێمەدا زۆر کەمە.

**پلەی حەوتەم:** چەسپان و بەردەوامی لەسەر حەق و ترسان لە عاقیبەت شەڕی، کە ئەمەش پیاوچاکان زۆر لێی دەترسان.

پرسیاری

## ٤٣ مانای کوفر چییەو جۆرەکانی چین؟

**وەڵام:** کوفر دوو جۆرە:

١-کوفرێک خاوەنەکەی لە میللەتی ئیسلام دەباتە دەرەوە، ئەمیش پێنج جۆرە:

**یەکەم:** کوفری بەدرۆخستنەوە: الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٢١﴾ الأنعام: ٢١

واتە: جا کێ هەیە لەوە ستەمکارتر بێت، کە شتی نادروست و درۆ بۆ الله هەڵدەبەستێت؟ یان ئایەت و فەرمانەکانی خوا بە درۆ دەزانێت؟! چونکە بەڕاستی ئەو ستەمکارانە سەرفراز نابن.

**دووەم:** کوفری خۆبەگەورە زانین و ملنەدان لەگەڵ بەڕاست زانین: الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤﴾ البقرة: ٣٤

واتە: کاتێکیش بە فریشتەکانمان وت: سوژدەی ڕێز بەرن بۆ ئادەم

سوژدەیان برد، جگە ئیبلیس نەبێت کە سەرپێچی کردو خۆی بە گەورەزانی و خۆی خستە ڕیزی کافرەکانەوە.

سێیەم: کوفری ڕاڕایی، ئەمیش بریتییە لە کوفری گومان: الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفۡسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا ۝٣٥ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيۡرًا مِّنۡهَا مُنقَلَبًا ۝٣٦ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرۡتَ بِٱلَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ۝٣٧﴾ الكهف: ٣٥ - ٣٧

واتە: ڕۆژێك چوو بۆ سەردانی یەکێك لە باخەکانی (لەگەڵ هاوەڵەکەیدا) لەکاتێکدا کە ستەمکار بوو لە خۆی (بەهۆی لە خۆبایی بوونیەوە)، بۆیە لەبەرخۆیەوە وتی: گومان نابەم کە ئەم باخ و باخاتە هەرگیز لەناو بچێت. واشنازانم قیامەت بەرپا دەبێت، سوێند بە الله ئەگەر بمگێڕنەوە بۆ لای پەروەردگارم دوای مردنم، ئەوە دڵنیام کە لای ئەویش جێگەو ڕێگەو چەندەها باخی ڕازاوەی لەمە باشترم بۆ ئامادە کراوە.

هاوەڵە ئیمانداره‌کەی لە کاتێکدا کە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرد پێی وت: ئایا کوفرت کرد بەو زاتەی کە سەرەتا تۆی لە خاك دروست کردووە؟! لەوەودوا نوفتەیەك بوویت، پاشان کردیتی بە پیاو؟!

چوارەم: کوفری پشت تێ کردن و بەڵگەش ووتەی الله تعالى یە کە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعۡرِضُونَ﴾ الأحقاف: ٣

واتە: ..کەچی بێ باوەڕان پشت هەڵدەکەن لەو ئاگاداری و بێدارکردنەوەیە.

پێنجەم: کوفری نیفاق و دوو ڕوویيە و بەڵگەش لەسەری ووتەی الله تعالى يە کە دەفەرمووێـت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ۝٣﴾ المنافقون: ٣

واتە: ئەو حاڵەتەشیان بۆیە تێدا دروست بووە چونکە سەرەتا باوەڕیان هێنا؛ لەوەودوا حەقیان پۆشی و کافر بوونەوە، بە هۆی ئەوەوە مۆر نرا بەسەر دڵیاندا (بۆیە تێگەیشتن و بیروبۆچوونیان شێواوە و) لە ڕاستیەکان تێ ناگەن.

٢-کوفرێکی بچوکە کە لە میللەتی ئیسلام نایباتە دەرەوە، ئەویش کوفری نیعمەتە، بەڵگەش لەسەر ئەم جۆرە ووتەی الله تعالى يە کە دەفەرمووێـت: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ۝١١٢﴾ النحل: ١١٢

واتە: الله تعالى نموونەی هێناوەتەوە (بە دانیشتوانی) شارێك کە ژیانیان بە هێمنی و ئاسوودەیی دەبردە سەر، لە هەموو لایەکەوە ڕزق و ڕۆزی جۆراو جۆریان بۆ دەهات (بەلاّم لە جیاتی سوپاسگوزاریی) ناشوکرو قەدرنەزانی نازو نیعمەتەکانی الله بوون، ئینجا الله تعالى پۆشاکی برسێتی و ترسی کردە کاڵای بالاّیان و تالاّوی نەداریی و ترسی پێ چەشتن لە سەر ئەنجامی ئەو ئیش و کارە (ناپوخت و ناڕێکانەدا) کە دەیانکردە پیشەی خۆیان.

وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ٣٤﴾ إبراهيم: ٣٤

واتە: بەڕاستی زۆربەی ئینسانەکان زۆر ستەمکارو خوانەناس و سپڵەن.

پرسیاری

## ٤٤ شیرک و هاوبەش بڕیاردان بۆ الله چییەو جۆرەکانی چین؟

**وەڵام:** باش بزانە کە تەوحید پێچەوانەی شیرکە.

شیرکیش سێ جۆرە: شیرکی گەورە، و شیرکی بچوک، و شیرکی شاراوە.

**جۆری یەکەم: شیرکی گەورە،** ئەمیش چوار جۆرە:

**یەکەم: شیرکی پاڕانەوە،** الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ٦٥﴾ العنكبوت: ٦٥

واتە: هەر کاتێک خەڵکی (باوەڕ لاواز) سواری کەشتی دەبن، مەترسی نوقم بوون و تیاچوون ڕوویان تێدەکات، زۆر بەکوڵ، هاناو هاوار بۆ الله دەبەن و بە دڵسۆزی و ملکەچیەوە باوەڕ دەهێنن، بەڵام کاتێک الله ڕزگاریان دەکات و دەگەنەوە وشکانی دەستبەجێ لە ڕێبازی یەکتاپەرستی دەترازێن و هاوەڵ و هاوبەش بۆ الله بڕیار دەدەن.

**دووەم: شیرکی نێت، ویست و مەبەست،** الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ١٥

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٦﴾ هود: ١٥ - ١٦

واته: هەرکەسێك تەنها ژیانی دنیاو ڕازاوەیی و (خۆشگوزەرانی) یەکەی بوێت. ئەوە پاداشتی هەوڵ و کۆششی ئەو جۆرە کەسانە دەدەینەوە لە دنیادا، ئەوانیش تێیدا هیچیان لێ کەم ناکرێتەوە.

ئا ئەوانە ئەوانەن کە لە ڕۆژی دوایدا جگە لە ئاگری دۆزەخ هیچی تریان بۆ نیە و ئەوەی کە کردیان لە دنیادا پووچەڵ بۆوە و بێ نرخە، هەروەها ئەو کاروکردەوەی کە دەیانکرد بەتاڵ و پووچ و بۆشە.

سێیەم: شیرکی گوێڕایەڵی کردن: الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٣١﴾ التوبة: ٣١

واته: (گاورو جوو) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی الله (ملکەچ و فەرمانبەرداریانن، ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەلاڵ یان حەرام دەکەن) هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیش (بەکوڕی الله دەزانن) لەکاتێکدا کە فەرمانیان پێنەدراوە جگە لە پەرستنی تاکە خوایەک، بێگومان جگە لەو زاتە پەرستراوێکی تر نیە، پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەیە، کە (ئەو نەفامانە) هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن.

**چوارەم: شیركی خۆشەویستی: الله تعالی دەفەرموویت:** ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾﴾ البقرة: ١٦٥

**واتە: هەندێك كەس هەیە لەجیاتی ئەوەی الله پەرست بێت، شتانی تر دادەتاشێت بۆ خۆی و خۆشەویستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرنامۆلكەو توولە ڕێگەیانە و خۆشی دەوێن، وەك چۆن ئیمانداران الله یان خۆش دەویت، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە زۆر زیاتر الله تعالی یان خۆش دەوێت،جا ئەوانەی كە ستەمیان كردووە گەر دەیانزانی لە كاتێكدا كە بەچاوی خۆیان ڕووبەڕووی ئەو سزایە دەبنەوە، كە بەڕاستی بۆیان دەردەكەوێت كە هێزو توانا و دەسەڵات هەر هەمووی بە دەست الله یە و دڵنیا دەبوون كە ئەو الله یە سزاكەی زۆر بە ئازارە (بۆ ستەمكاران).**

**جۆری دووەم: شیركی بچوكە، ئەویش بریتییە لە ڕیاو ڕوپامایی: الله تعالی دەفەرموویت:** ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾﴾ الكهف: ١١٠

**واتە: جا هەركەسێک دەیەوێت بەدیداری پەروەردگاری شاد ببێت بە خۆشنودیەوە با كارو كردەوەی چاک و دروست ئەنجام بدات و بەهیچ شێوەیەک لە پەرستندا هیچ كەسێک نەكاتە هاوەڵ و شەریک بۆی.**

جۆری سێیەم: بریتییە لە شیرکی شاراوە، وە بەڵگەش ئەو فەرمودەیەیە کە دەفەرموێت: (الشرك في هذه الأمة أخفى من دبيب النمل على الصفاة السوداء في ظلمة الليل).

واتە: شیرک لەم ئوممەتەدا شاراوەترە لە جێگا پێی مێروولە لەسەر تاشە بەردی ڕەش لە شەوێکی تاریکدا.

پرسیاری

٤٥ جیاوازی چییە لە نێوان قدەر و قەزا؟

وەڵام: قەدەر لە بنچینەدا چاوگ مەصدەری (قدر)ە، پاشان بۆ تەقدیر بەکارهێنراوە کە بریتییە لە وورد کردنەوەو ڕوونکردنەوە، هەروەها بەکارهێنراوە دوای زاڵبوون بۆ تەقدیری الله بۆ بونەوەر پێش ڕوودانی.

بەڵام قەزا: دەربارەی حوکمی کەونی بەکاردێت، بە ڕوودانی قەدەرەکان و ئەوەی لە کتێبەکانی پێشوودا نوسراوە، وە جاری وا هەیە ئەمە بەکاردەهێنرێت بۆ ئەو قەدەرەی کە وردەکاری و جیاکردنەوەیە.

هەروەها ووشەی قەدەر بە مانای قەزا بەکاردەهێنرێت کە بریتییە لە حوکمی کەونی بە ڕوودانی قەدەرە دیاری کراوەکان.

وە قەزا بەکاردەهێنرێت بۆ حوکمە دینی و شەرعییەکان، الله تعالى دەفەرموویێت: ﴿ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ﴾ النساء: ٦٥

واتە: دوای ئەوەش نابێت لە دڵ و دەروونیاندا هیچ ناڕەزاییەک دروست ببێت بەرامبەر ئەوەی کە داوەریت لەسەر کردووە ...

هەروەها قەزا بەکاردەهێنرێت بۆ **لێبونەوەو تەواو بوون وەک الله تعالى دەفەرموویێت:** ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ﴾ الجمعة: ١٠

واتە: جا کاتێك نوێژ تەواو بوو...

وە بەکاردەهێنرێت بۆ خودی کردارەکە، الله تعالى دەفەرموویێت: ﴿فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ﴾ طه: ٧٢

واتە: چیت لەدەست دێت ئەنجامی بدە و درێغی مەکە.

وە بەکاردەهێنرێت بۆ ڕاگەیاندن و گەیاندنی هەواڵ، الله تعالى دەفەرموویێت: ﴿وَنَادَوۡاْ يَٰمَٰلِكُ لِيَقۡضِ عَلَيۡنَا رَبُّكَ﴾ الزخرف: ٧٧

واتە: دۆزەخیەکان هاوار دەکەن، ئەی مالك (کە فریشتەی سەرپەرشتیارە): دەبا پەروەردگارت بمانکوژێت، دەبا بمرین و کۆتایی بەم سەغڵەتیەمان بێت...

وە بەکاردەهێنرێت بۆ ببنی سزا، الله تعالى دەفەرموویێت: ﴿وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ﴾ هود: ٤٤

واتە: فەرمانیش بەڕێکی و تەواوی ئەنجامدرا.

وە بەکاردەهێنرێت بۆ دەستڕاگەیشتن بەسەر شتێک و تەواو کردنی، وەک دەفەرموویێت: ﴿وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مِن قَبۡلِ أَن يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥ﴾ طه: ١١٤

واتە: (ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەکەیت لە خوێندنی قورئاندا پەلە بکەیت: لە پێش ئەوەی وەحی و نیگای ئەو قورئانە تەواو ببێت بۆ لای تۆ..

وە بەکاردەهێنرێـــت بـــۆ یەکلاکـــردنەوەو بڕیـــاردان وەک الله تعـــالی دەفەرمووێت: ﴿وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ﴾ الزمر: ٧٥

واتە: و حەق و دادوەری لە نێوان هەمواند جێبەجێ کرا..

وە بەکاردەهێنرێت بـۆ بەدیهێنـان، الله تعـالی دەفەرمووێـت: ﴿فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ﴾ فصلت: ١٢

واتە: ئاسمانی کردە حەوت چین..

وە بەکاردەهێنرێت بۆ بێ گومانی و حەتمی، وەک الله تعالی دەفەرمووێـت: ﴿وَكَانَ أَمۡرٗا مَّقۡضِيّٗا ٢١﴾ مريم: ٢١

واتە: ئیتر ئەو کارەش بڕیاری لەسەر دراوە و بڕاوەتەوە.

وە بەکاردەهێنرێت بـۆ مەسـەلەی دینی، وەک الله تعـالی دەفەرمووێـت: ﴿أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ﴾ يوسف: ٤٠

واتە: فەرمانیشی داوە جگە لە خۆی کەسی تر نەپەرستن..

وە بەکاردەهێنرێت بۆ گەیشتن بە پێویسـتی، وەک دەوترێـت: گەیشـتم بە پێویستییەکەم.

وە بەکاردەهێنرێـت بـۆ پابەنـد کردنـی دوو کەس کە کێشـەیان هەیە بە حـوکم و بڕیـارەوە، وە بەکاردەهێنرێـت بە مانـای جیبەجێکـردن، وەک الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا قَضَيۡتُم مَّنَٰسِكَكُمۡ﴾ البقرة: ٢٠٠

واتە: جا هەر کاتێک ئەرک و مەناسیکەکانتان بەجێ هێنا..

وە قەزا لە سـەرجەمیاندا: چـاوگەو فەرمـانێکە بـۆ واجبێتـی و بەڵـگەیە لەسـەری، وە الإقتضـاء بـریتییە لە: زانیـاری بـوون بە شـێوازی ڕێکخسـتنی دەق و دەسـتەواژە، وەک وتـراوە: سەرسـامی لێـوە نـازانم، وە الأصـمعي ووتویەتی: دەمێنێتەوەو تەواو نابێت.

پرسیاری

٤٦ ئایا قەدەر خێـر و شـەڕی هەمووی بەشێـوەیەکی گشتی لە الله وەیە یان نا؟

وەڵام: قەدەر خێر و شەڕی بە شێوەی گشتییە، چونکە ڕیوایەت کراوە لە عەلی یەوە فەرمویەتی: ئـێمە لەگەڵ جەنازەیەکدا ڕۆیشـتین و بردمان بـۆ بەقیعـی غەرقەد، پێغەمـبەری خـوا ﷺ هـات و دانیشـت و ئـێمەش لە دەوری دانیشـتین، پـارچە دارێکـی بچـوکی بە دەسـتەوە بـوو، سەری دانەواند بوو بەو دارە لە زەوییەکەی دەدا، پاشـان فەرمـووی: (هیچ یەکێک لە ئێوە نییە، هیچ نەفسێک نییە ئیلا الله جێگاکەی دیاری کـردووە لە بەهەشتە یان لە دۆزەخ، وە ئـیلا نوسـراوەو بڕیـار دراوە دۆزەخـی و چارە ڕەشە یان کـامەران و بەهەشـتی)، دەفەرمووێـت: پیاوێـک پرسـیاری کـردو ووتی: ئایا بۆ خۆمـان لەسـەر ئەو بڕیـارەی بۆمـان دراوە دانەنیشـین و واز لە کـردەوە نەهێنـین؟ فەرمـووی: (هەرکەسـێک لە ئەهلـی کامەرانـان بێـت بەرەو کـردەوەی ئەهلـی کامەرانـان دەجوڵێـت و ئەنجـامی دەدات، وە

هەرکەسێک لە ئەهلی بەدبەختان بێت بەرەو کردەوەی ئەهلی بەدبەخت و چارەڕەشـــان دەچێـــت) پاشـــان ئەم ئـــایەتەی خوێنـــدەوە کە دەفەرمووێـــت: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ۝٦ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ۝٧ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ۝٨ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ۝٩ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ۝١٠﴾ الليل: ٥ - ١٠

واتە: جا ئەوەی دەبەخشێت و پارێزکار و لە خوا ترسە، بڕوای بتەوی بە پاداشتی چاک و بەنرخی خوایی هەیە، ئەوە ڕێگەی چاکە و چاکەکاری بۆ ئاسان دەکەین و سەرئەنجام دەیخەینە خێر و خۆشیەوە، بەڵام ئەوەی ڕەزیل و دەست نوقاو بێت و خۆی بێ نیاز بزانێت (ڕەزامەندی خوایی مەبەست نەبێت)، بڕوای نەبێت بە پاداشت و بەهرەی چاکی خوایی و بەدرۆی بزانێت، ئەوە ئێمە ڕێبازی تەنگانە و ناخۆشی بۆ ئاسان دەکەین و سەرئەنجام بە دۆزەخی دەگەیەنین.

وە لە فەرمودەدا هاتووە: وە کردەوە ئەنجام بدەن چونکە هەمووان ئەو کردەوەیان بۆ ئاسان دەکرێت کە سەرەنجامەکەیان بۆی دەچیت، ئەهلی دۆزەخ کردەوەی دۆزەخییان بۆ ئاسان دەکرێت و ئەهلی بەهەشتیش کردەوەی ئەهلی بەهەشتیان بۆ ئاسان دەکرێت) پاشان ئەو ئایەتەی خوێنـــدەوە کە دەفەرمووێـــت: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ۝٦ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ۝٧ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ۝٨ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ۝٩ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ۝١٠﴾ الليل: ٥ - ١٠

پرسیاری

## ٤٧ مانای لا اله الا چییه؟

وەڵام: ماناکەی واتە هیچ پەرستراوێک نییە بە هەق جگە لە الله، بەڵگەش ووتەی الله تعالی یە کە دەفەرموویت:﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ﴾ الإسراء: ٢٣

واتە: پەروەردگاری تۆ بڕیاریداوە کە جگە لەو کەسی تر نەپەرستن..

جا ووتەی ﴿أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ﴾ مانای لا الە ی تیایە، وە وتەی ﴿إِلَّآ إِيَّاهُ﴾ مانای الا الله یە.

پرسیاری

## ٤٨ ئەو تەوحیدە چییە کە الله تعالی لەسەر بەندەکانی خۆی فەرز کردووە لە پێش ئەنجامدانی نوێژ و ڕۆژوو؟

وەڵام: بریتییە لە تەوحیدی پەرستش، کە نابێ بپاڕێنەوەو داوا بکەن لە هیچ کەسێک تەنها لە الله نەبێت بە بێ هاوبەش بڕیار دان بۆی، نە لە پێغەمبەر بپاڕێنەوە نە لە کەسی تر، هەر وەک الله تعالی دەفەرموویت:﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ ﴾ الجن: ١٨

واتە: دڵنیابن کە: مزگەوتەکان تایبەتی الله تعالین، دەبێت هەر ئەوی تێدا بپەرسترێت و ناوی کەسی تر نەکرێتە شەریك و هاوتای ناوی ئەو زاتە.

پرسیاری

٤٩ کامیان باشترە: هەژارێکی ئارامگر یان دەوڵەمەندێکی شوکرانەبژێر؟ وە ئایا سنووری ئارامگری و سنووری شوکرانەبژێری چییە؟

وەڵام: بابەتی دەوڵەمەندی و هەژاری، ئارامگرو شوکرانەبژێر هەردووکیان لە باشترین ئیماندارانن، وە چاکترینیان ئەوەیانە کە تەقوادارتر و لە الله ترسترە، هەروەک الله تعالی دەفەرموویت: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ الحجرات: ١٣

واتە: بەڕاستی بەڕێزترینتان لای الله تعالی ئەو کەسانەتان کە زۆرتر لەخواترسەو فەرمانبەرداری الله یە.

بەڵام سنووری ئارامگری و سنووری شوکرانەبژێری: ئەوەی کە بڵاوە لە ناو زانایاندا ئەوەیە کە ئارامگری گلەیی نەکردنە، شوکریش ئەوەیە کە گوێڕایەڵی الله بکەیت بەو نیعمەتەی پێی بەخشیویت.

پرسیاری

٥٠ بە چ شتێک ئامۆژگاریم دەکەیت؟

وەڵام: ئەو شتەی ئامۆژگاریت دەکەم بە ئەنجامدانی و هانت دەدەم لەسەری بریتییە لە: شارەزا بوون لە تەوحید، و خوێندنەوەی کتێبەکانی تەوحید، چونکە ئەمە ڕاستی ئەو تەوحیدەت بۆ ڕوون دەکاتەوە کە الله

تعالى پێغەمبەری خۆی پێ ڕەوانە کردووە، وە شارەزا بوون لە ڕاستێتی ئەو شیرکەی الله و پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە، و هەواڵی داوە کە هەرگیز لێی خۆش نابێت، و هەرکەسێک ئەنجامی بدات بەهەشت لەسەری حەرامە، و هەرکەس بیکات کردەوەکانی پوچەڵ دەبنەوە.

هەموو ڕێزێکیش لە زانینی ڕاستێتی ئەو تەوحیدەدایە کە الله پێغەمبەرەکەی پێ ڕەوانە کردووە، و بە هۆیەوە مرۆڤ دەبێتە موسڵمان و لە شیرک و ئەنجامدەرانی شیرک جیادەبێتەوە.

**شتێکم بۆ بنوسە الله بەهۆیەوە سوودم پێ گەیەنێت.**

یەکەم شتێک کە ئامۆژگاریت دەکەم: ئاوڕدانەوە بە لای ئەوەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە لایەن الله وە تبارک و تعالی هێناویەتی، چونکە ئەو لە لایەن الله وە هەموو ئەو شتانەی هێناوە کە خەڵکی پێویستیان پێیەتی، هیچ شتێکی بە جێ نەهێشتووە لەوانەی نزیکیان دەکاتەوە لە الله و دەیانخاتە بەهەشتەکەیەوە ئیلا فەرمانی پێ کردوون،

وە هیچ شتێکی جێ نەهێشتووە کە دووریان دەخاتەوە لە الله و نزیکیان دەخاتەوە لە سزاکەی ئیلا نەهی لێ کردوون و ئاگاداری کردونەتەوە لێی، وە بەهانەو حوجەی لەسەر دروستکراوانی بڕیوە هەتا ڕۆژی دوایی، هیچ کەسێک هیچ بەهانەیەکی نییە لەسەر الله دوای ناردنی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

الله عزوجـــل دەربـــارەی پێغەمـــبەر محمـــد صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ و بـــرا پێغەمبەرەکـانی دەفەرموویـت: ﴿۞إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ١٦٣ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ١٦٤ رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ١٦٥﴾ النساء: ١٦٣ - ١٦٥

واتە: بەڕاسـتی ئێمـە (وحـی)و نیگامـان بـۆ تـۆ نـاردووە هـەر وەکـو چـۆن (وحـی) و نیگامـان بـۆ نـوح و پێغەمبـەرانی دوای ئـەو نـاردووە، هـەروەها (وحی) و نیگامان ناردووە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یـەعقوب و (هەنـدێک) لـە کـوڕانی یـەعقوب و عیسـا و ئـەیوب و یـونس و هـاروون و سـولەیمان، زەبوریشـمان بـە داود بەخشـیووە. بێگومـان بەسـەرهـاتی هەندێک لە پێغەمبەرانمان بۆ گێڕاویتەوە، بەسەرهاتی هەندێکی تریشمان بـۆ نەگێڕاویتـەوە، بەڕاسـتی الله تعـالى خـۆی لەگـەڵ موسـادا گفتوگـۆی یەکسەری و ڕاستەوخۆی ئەنجامداوە. پێغەمبـەرانمان (ڕەوانـە کـردووە) کە مژدەدەرن (بە ئیمانداران) و ترسێنەرن بۆ (یاخیەکان)، تا خەڵکی هیچ بەڵگەیـەکیان بەدەسـتەوە نـەمێنێت (لەسـەر بـێ دینـی و یـاخی بوونیـان) دوای ئـەوەی الله پێغەمبـەرانی بـۆ ڕەوانـە کـردوون، بێگومـان هەمیشـەو بەردەوام الله باڵادەست و دانایە.

جا گەورەترین شتێک کە لە لایەن الله وە هێناویەتی و یەکەم شتێک کە فەرمانی بە خەڵکی کردووە بریتییە لە تەوحیدی الله بە بەتەنها پەرستنی بە بێ هاوبەش بۆ بڕیاردان، وە بە دڵسۆزی و پاکی بە تەنها دینداری بۆ الله کرێت، وەک الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ۝٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ۝٣﴾ المدثر: ١ - ٣

واتە: ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوە، ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ هەستەو خەڵکی بێداربکەرەوە (ڕاستیەکان ڕوون بکەرەوە). پەروەردگارت بە گەورە ناوببە و مەزنی ئەو زاتە ڕوون بکەرەوە.

وە مانای ﴿وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ۝٣﴾ واتە: پەروەردگارت بە گەورە دابنێ بە تەوحیدو و تەنها ئەنجامدانی پەرستش بۆی بە بێ هیچ هاوبەشێک، ئەمەش پێش فەرمان کردن بوو بە نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج و شەعائیرەکانی تری ئیسلام.

وە مانای ﴿قُمۡ فَأَنذِرۡ ۝٢﴾ واتە: ئاگاداری خەڵکی بکەرەوە لە شیرک ئەنجامدان لە پەرستنی الله بە بێ هیچ هاوبەش دانانێک بۆی، ئەمەش پێش ئاگادار کردنەوەیان بوو لە زیناو دزی و ڕیباو ستەم کردن لە خەڵک و تاوانە گەورەکانی تر.

ئەم بنچینەیەش گەورەترین و لەپێشترین بنچینەی دینە، هەر لەبەر ئەمەش الله مەخلوقاتی بەدیهێناوە، هەروەک الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾ الذاريات: ٥٦

واتە: بێگومان من پەری و ئادەمیزاد م دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن .

وە لەبەر ئەمەش الله پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووەو کتێبەکانی دابەزاندووە، هەروەک الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ﴾ النحل: ٣٦

واتە: سوێند بە الله بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها الله بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر..

وە لەبەر ئەمەش خەڵکی دابەش بوون بەسەر موسڵمان و کافردا، هەرکەسێک لە قیامەتدا بگات بە الله بە موەحیدی و هیچ شیرکی بۆ ئەنجام نەدابێت دەچێتە بەهەشتەوە، وە هەرکەسێکیش بە شیرکەوە بگەتەوە پێی دەیخاتە دۆزەخ، ئەگەرچی لەهەموو کەسێک عیبادەتی زیاتریش بوبێت، ئەمەش مانای ئەو ووتەیەتە کە دەیڵێیت: (لا إلە إلا الله)، چونکە (الإله) ئەوەیە کە داوای لێ دەکرێت و ئومێدی پێ دەبرێت بۆ دەستکەوتنی چاکەو دوور خستنەوەی خراپە و لێی دەترسیت و پشتی پێ دەبەسترێت.

# ناوەڕۆک


تمت بحمد الله

